| چەند ساتێك لەگەڵ ئیلحاد ومولحیدان –

# خەیاڵی ئەخلاق

یحیی رفاعي سرور

و: دانا شافیعی

**"بڕوایەکی جێگیرم بەوەیە کە تاکە مرۆڤێکی خاوەن ژێرخانێکی دروستی ڕەوشت وئەخلاق مرۆڤی مولحیدە، چونکە مرۆڤی مولحید کاری چاك تەنها بۆ ئەوە ئەنجام ئەدا .. کە کاری چاکە .. نە چاوەڕێی دەسکەوتێکەو نە لە ترسێکەوە دەیکات. هەر ئەمەش ئەو هۆکارەیە کە کۆمەڵێك کۆمەڵگای هاریکار وخاوەن ڕەوشت وئاست بەرزی دروست کردووە".**

ئەو بڕگەی سەرەوە، دەستەواژەیەکی بەربڵاوی نێو مولحیدانەو بە چەندین شێواز گوزارشی لێ دەکەن، هەموویشیان دەگەڕێنەوە سەر یەك مانا ..

بەڵام خودی ئەو قسانە ڕاستیان نییە .. نەك لەبەر ئەوەی ئێمە بڕوامان بە بەهاو قیمەتی ڕەوشی ڕەهاوە نییە؛ واتا ئەو کارەی مرۆڤ بێ هیچ بەرامبەرێك ئەنجامی ئەدات .. بەڵام لەبەر ئەوەی خودی ئەو کردارە؛ ئاین داوای دەکات وهانی لەسەر ئەدات. بۆیە ناکرێ وەکو بەرامبەرێکی ئاین بە کار بهێنرێ، چونکە خودی ئاین ئەو مانایەی لە خۆدا گرتووە ..

بەڵام ئەوەی دین وئاین جیادەکاتەوە خاڵێکی ترە .. ئەویش پوخت کردنەووە ڕێك وپێك کردنی کرداری ڕەوشتی وئەخلاقییە لە ڕێگەی دوو ئامرازی ترەوە :-

یەکەمیان: ئەو پێوەرانەی جیان لە خودی مرۆڤ وئینسان (حوکمە شەرعییەکان) ..

دووەم: پاڵنەرە هەستی و سوودبەخشە هاندەرەکان (پاداشتی دوارۆژ) .

-با باسی خاڵی یەکەم بکەین .. ئەویش زەروورەتی بوونی کۆمەڵە حوکم وپێوەرێکە؛ لە مرۆڤەوە جیا بن بۆ ئەوەی هەڵسوکەوتی ئەو مرۆڤە کۆنترۆل کەن وقەوارەو چوارچێوەیەکی بۆ دارێژن .

ڕەوشت وئەخلاقی ڕەها واتا مرۆڤ چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خۆیدا دەکات؛ ئاوا هەڵسوکەوت لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا بکا .. ئەمەش ناوەڕۆکی قسەکانی (ریچارد دۆکنز)ـە، لە هەوڵێکدا کە ڕیزبەندێکی ئەخلاقی بەدی بێنێت کە لە عەینی کاتدا پێچەوانەی ئیلحاد نەبێتەوە .. گومانیش لەوەدا نییە کە ئەو قسانە دروستن، هەر ئەوەش کرۆکی گوتەی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم ئەو کاتەی گەنجێك داوای لێکرد مۆڵەتی بدات ولە تاوانبارێتی "زینا"دا عەفوویکا، پێغەمبەر پێی فەرموو: (حەز دەکەی دایکت کاری وا بکات ؟ گوتی: نا بە خوا، خوا بە قوربانی تۆم کات .. پێغەمبەر فەرمووی: دەی کەواتە خەڵکیش حەز ناکەن دایکیان کاری وا بکەن .. پاشان فەرمووی: حەز دەکەی کچەکەت کاری وا بکا، گوتی: نا بەخوا، خوا بە قوربانی تۆم کات .. فەرمووی: دەی کەواتە خەڵکیش حەز ناکەن کچەکانیان تووشی شتی وا بن ... ) تا دوایی فەرموودەکە .

بەڵام ئەم چەشنە لە بیر کردنەوە کافی نییە بۆ ئەوەی ڕەوشت وهەڵسوکەوتی مرۆڤ کۆنترۆڵکا، چون ئەو جۆر بیر کردنەوەیە پشت بە پاکی وپاراوی وێنەی مرۆڤ دەبەستێ لە بەرامبەر خۆیدا، کە خاوەن فیترەت وسروشتێکی ساغ وسەلیم بێ. بەڵام کۆمەڵە حاڵەتێکی تر هەن کە فیترەت وسروشتی مرۆڤیان تێدا دەگۆڕێت ویاخود فیترەتی مرۆڤ توانای گەیشتنی بە ڕاستی نابێ، بۆیە گەر فەرزمان کرد ئەو گەنجەی هاتە لای پێغەمبەر

ومۆڵەتی زینای لێ داوا کرد؛ مرۆڤێکی ڕۆژئاوایی بووایە وبە کاریگەری شارستانییەتدا گۆڕانی بەسەردا هاتبا، پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم هەمان پرسیاری لێ کردبا: (حەزت لێیە دایکت شتی وا بکا ؟ .. حەز دەکەی کچەکەت وا بکا .. حەز دەکەی خوشکت وا بکا ؟ ) وەڵامی کابرا - بە کاریگەری شێوانی وێنەی فیکریی مرۆڤانەیدا - وەڵامێکی شێواو دەبوو .. لەوانەیە بیگوتبا: (قەی چی ئەکا پێغەمبەری خوا ؟ .. مادام خۆی ڕازییە) ؟

لێرەدا دین دێتە قسەو پارێزگاری لە مرۆڤ دەکا لەوەی بەرەو دیدی خودی خۆی بە ئارەزووی خۆی وبە شێوازێکی نا گونجاودا بڕوات .. بەو شێوەیە پێوەرە ئەخلاقییەکانی لە ڕێ لا بدەن .. بۆیە وا چاکە لێرەدا پێوەرێکی دەرەکی هەبێت وپەیوەست بە ئارەزوو و ویستی مرۆڤەوە نەبێ .. ئەویش پێوەری حوکمە شەرعییەکانە .. بۆیە ئەو کات پێغەمبەر لە وەڵامی ئەو مرۆڤە شێواوەدا دەیگوت: (.. گەر تۆ پێی ڕازی بی، خوا پێی ڕازی نییە) .

-خاڵی دووەم کە ژیانی مرۆڤ لە دیدی ئاینیدا کۆنترۆل دەکات؛ پاڵنەری هەستییە .. واتە پاداشت وسزا .. بەهەشت وئاگر ..

لە ڕاستیدا مرۆڤی مولحید شانازی بەوە دەکا کە ئەو پڕ بە مانا مرۆڤێکی ئەخلاقییە، چون ئەو بە کار وکردارە جوان وپیرۆزەکانی هەڵدەستێت وچاوەڕێی هیچ پاداشتێکی دوارۆژیان لێوە ناکا ..

کە لێشی دەپرسی: چۆن بناغە بۆ ڕیزبەندی ئەخلاقی خۆت دادەڕێژی ؟ دەڵێ: (کارەکە زۆر ئاسانە: کۆمەڵگا بە سروشتی وتەبیعەتی خۆیەوە بەها ڕەوشتییەکانی خۆی دەردەخات، بە شێوەیەك کە زیاترین سوودی بۆ دابینکات) ؟

باشە ئەمە سوودەو ئەویش سوود ! چۆن بە لای مرۆڤی مولحیدەوە سوودی دوارۆژ بەهای کاری ئەخلاقی دەفەوتێنێ، بەڵام لە هەمان کاتدا سوود وپاداشتی کۆمەڵایەتی بەهای ئەخلاقی کردارەکان نافەوتێنێ !

بەڵکو ئەگەر باسی سوودی دوارۆژ بکەین، خوای پەروەردگار هۆشی تاکەکانی پێ دەدوێنێ .. کەچی سوودی کۆمەڵایەتی لە لایەن کۆمەڵگاوە لە ناخی تاکەکاندا دەچەسپێنرێ، بێ ئەوەی ڕیز لە ویستی ئازادی ئەو تاکانە بگیرێ .. ئیتر ئاخۆ لە ڕووی ئەخلاقییەوە کامە سوود بەرزتر وڕێك وپێکترە ؟

کام لەو دوو سوودە شایستەی ئەوەیە بڵێین کە پێچەوانەی بەهای ئەخلاقی نییە ؟

ئێمە نکووڵی لە بەهاو قیمەتی ئەو ڕەوشتانە ناکەین کە لە ڕێگەی کۆمەڵگاوە لە ناخی تاکەکاندا دەچەسپێنرێن، تەنانەت ئەگەر ئەو تاکانە تاکێکی دیندار نەبن .. بەڵام قبووڵمان بە فەخر وشانازی مولحیدەکان نییە کە خەڵکانێك بن تەواو لە سوود ونەفعیەتەوە دوور بن .. چونکە هەمان ئەو پێوەرەیان دەچێتەوە ژێر باری سوود ومەنفەعەت .. هەر چۆنیش بێ؛ بەها ئاینییەکان لە ئەساسدا ئەو پێوەرەیان لە خۆدا گرتووە .



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

٢٠١٦ - ١٤٣٨